# حاجی مراد

نووسەر: سادق هیدایەت

وەرگێڕان: میلاد خزری

حاجی مراد لەسەر پێڕکی دوکانەکە پازی دا. دوو قامکی لەبەر پشتێنی نا و کەمربەندە زێوەکەی هەڵکێشا. داوێنی عەبایەکەی گرت و ڕایتڵەکاند. دەستێکی بە سەروسمێڵە خەنە لێدراوەکەیدا هێنا و گاسی لە حەسەنی شاگردی کرد. پێکەوە دەرگای دوکانەکەیان داخست؛ دەستی لە گیفانی نا و چوار قرانییەکی خستە مستی حەسەنەوە، حەسەن بە شەقاوەهەڵداشتن و فیتەلێدان لە نێو ئاپۆرەی خەڵکیدا ون بوو. حاجی عەبا زەردەکەی بنهەنگڵی دەرێنا و بە شانی خۆیدا دا و چاوێکی لە دەوروبەری کرد و سینگی دەرپەڕاند و هێدیهێدی ڕێ کەوت. بە هەنگاوی لاقانی کەوشە تازەکانی وە جیڕەجیڕ دەکەوتن. هەرچی حاجی مرادی دەدیت سڵاو و خوڵقی دەکرد: سڵاوت لێ بێ حاجی، کەیفت چۆنە حاجی؟ با لە خزمەتتدا بین؟ ... حاجی گوێی لەم قسانە ئاخندرابوو بەڵام گرنگایەتیەکی تایبەتی بە وشەی حاجی دەدا، هەرگا پێیان دەکوت حاجی گەزگەز باڵای دەکرد، ڕەند و مێرخاسانە وڵامی سڵاوی دەدانەوە.

ئەم وشەیە بۆ ئەو وەک نازناو بوو هەرچەند دەشیزانی نەچووەتە حەج و حاجی نیە. هەر ئەوەندە کە منداڵ بوو و باوکی مرد و دایکی لە ڕووی وەسیەتی باوکی هەرچی هەبوو و نەبوو فرۆشتی، کردیە زێڕ و تێکڕا چوونە کەربەلا. دوو ساڵێکی بەسەردا تێپەڕی، پوڵ و زێڕیان نەما و دەستیان کرد بە سواڵ و گەدایی. حاجیش بە هەر چەرمەسەری و بەوبەختیەک بێ خۆی گەیاندبووە هەمەدان خزمەت مامی. خوداوڕاستان مامیشی مرد و چون کەسیشی نەبوو هەموو ماڵ و داراییەکەی بۆ حاجی بەجێ ما. مامی لە بازاڕدا بە حاجی ناوزەد کرابوو، ئەم نازناوەشی هەر بە لەگەڵ ماڵەکە بە میرات بۆ بەجێ ما. لەم شارە پان و بەرینەدا کەسی نەبوو. دوو-سێ چەلان هەوڵی دا دایک و خوشکی لە کەربەلا بدۆزێتەوە بەڵام نەیدیتنەوە.

دوو ساڵێک دەبوو حاجی هاوسەرگیریی کردبوو بەڵام لە ژنەوە بۆی نەهاتبوو. ماوەیەکی زۆر بوو هەر شەڕ و کێشمەکێشیان بوو. حاجی بەرگەی هەمووشتی دەگرت، بەرگەی تانەوتەشەر و پلارەکانی ژنەکەی نەدەگرت. ئەویش بۆ ئەوەی ژنەکەی بترسێ و واز بێنێ لێی دەدا. زۆرجاران پەشیمانیش دەبووەوە؛ زووەکی باوەشیان بە یەکتریدا دەکرد و پێک دەهاتنەوە. ئەوەی کە حاجی هێشتا منداڵی نەببوو کاریگەرییەکی زۆری لەسەر بەدخوڵقی و تووڕەییەکەی دانابوو. چەند جارێک هاوڕێیەکانی پێیان کوتبوو ژنێکی دیکە بێنێ بەڵام حاجی فریوی نەخواردبوو و دەیزانی کە ژنێکی دیکە یانی بەوبەختیەکی دیکە. بۆیە گوێیەکی دەرگا بوو ئەوەی دی دەروازە. ئینجا ژنەکەی خۆشی هەروا جوان و جحێڵ بوو و

ماوەیەکی زۆر بوو پێکەوە بوون و هەرچۆنێکی بێ باش یان خراپ، سەریان پێکەوە نابوو و هۆگری یەکتری ببوون. حاجی بۆخۆشی پەکی نەکەوتبوو، قیتوقۆز بوو؛ ئەگەر خودا هەویستبای هێشتاش درەنگ نەببوو بۆ منداڵ. بۆیە نەیدەویست لە ژنەکەی جودا بێتەوە بەڵام ئەم ئەخلاقە خراپەشی بۆ تەرک نەدەکرا: لێی دەدا و ژنەکەشی چڕ و لاسارتر دەبووەوە. بەتایبەت لە دوێشەوێوە نێوانیان پیس تێکچووبوو.
حاجی دەنکدەنک دەنکەشووتیی دەهاویشتە دەمییەوە و توێلکە ترووکاوەکەی تف دەکردەوە؛ لە چاوەی بازاڕەکەوە وەدەر کەوت. ئیستێکی گرت و ئەو هەوا پاکە بەهارییەی هەڵمژی و بۆ چەندێک هۆشی ڕۆیی. وە خۆی هاتەوە و بیری کەوتەوە کە دەبێ بچێتەوە. دیسان کێشمەکێش و مشتومڕ، دیسان دەملەدەمنانەوە، قسەیەکی لەم و قسەیەک لەو، دیسان کوتەک و لێدان. ئینجا هەڵمساو و قەڵس دابنیشنە سەر سفرە و مۆڕە لە یەکتری بکەن و بچنە نێو جێگاوبانەوە و قون تێک بکەن. شەوی هەینیش بوو، دەیزانی ژنەکەی سەوزیپڵاوی لێ ناوە. سەری حەوت کێوانی لێ داهاتبوو. قسەی هاوسەرەکەی وە بیر هاتنەوە: «بڕۆ ب! حاجی؟! ناوەڵا زڕەحاجی! حاجی کوێ؟ ئەتۆ حاجیی؟ ئەدی بۆ دایک و خوشکت لە کەربەلا هەرزە و بەرەڵا دەخولێنەوە و کەس تێیان ناترێ؟ من چەند سادە بووم، ئەگە مەشەدی وسێنی زێڕنگر ناردییە سەرم جوابم نەداوە و مێردم بە تۆی بێلیاقەتی پێ‌پەتی کرد. حاجیی درۆیینە!» سوور و شین هەڵگەڕابوو، لێوی دەکرۆشت، ئەگەر ژنەکەی لە کنی بایە هەڵیدەدڕی.
بەرەبەرە گێشتبووە شەقامی بەینولنەهرین، چاوی لە دارەبییە سەرسەوز و گەشەکانی لێواری چۆمەکە دەکرد. لە کەلەی دا سبەی لەگەڵ دۆستان بچنە دۆڵی مرادبەگی و تا ڕۆژپەڕان پێکەوە ڕایبوێرن. هەرچیش بێ لە ماڵێ خۆشترە، نە بۆخۆی هەراس دەبێ نە ژنەکەی. گەیشتە سەری کۆڵانی ماڵەکەیان. لەپڕێکدا هەستی کرد ژنەکەی بە پەنایدا تێپەڕی و لای بۆ نەکردەوە. بەڵێ، ئەمە ژنەکەی بوو. نەک ئەوەی کە بڵێین حاجی وەکوو زۆربەی پیاوان بتوانێ ژنەکان لە بن چارشێویشدا بناسێتەوە؛ ژنەکەی نیشانەیەکی تایبەتی هەبوو، یانی بەو نیشانەیە دەیتوانی ژنەکەی بناسێتەوە. ژنەکەی بوو؛ بە زێواری چارشێوەکەیەوە ناسییەوە. سێودووی لێ نەدەکرا، حاجی دڵاودڵ نەبوو. بەڵام بۆ دیسانەکە بەبێ ئیزنی حاجی وەدەر کەوتبوو؟ ئەویش بەم وەختە! خۆ نەهاتبووە دوکانیش بڵێین کارێکی هەبووبێ. بڵێی چووبێتە کوێ؟ حاجی هەنگاوی هەڵێنان، بەڵێ ژنەکەی خۆی بوو، خۆ ناشچێتەوە! کتوپڕ ڕقی هەستا و خوێن بەری چاوی گرت. دەیویست بیگرێ و دەست لە تینتینۆکەی بنێ و قرخەی لێ ببڕێ. هەرای کرد:
-شاربانوو!
ژنە ڕاچەنی و نیوەئاوڕێکی داوە، وەک ئەوەی ترسابێ. بەلەزتر هەنگاوی نانەوە. حاجی عەرزی نەدەگرت. ئاگری تێبەر ببوو. ژنەکەی بەبێ ئیزن وەدەرکەوتبوو هیچ، وڵامیشی نەدەداوە! دیسان گاسی کردەوە:
-هۆی! لەگەڵ تۆمە. ئەوە لە کوێ دێیەوە؟ ڕاوەستە بزانم. هۆی!
ژنە وێستا و دەنگی لێ بەرز کردەوە:

-بە تۆ چی؟ هەتیوە لاپرەسەنەی خوێڕی، ئاگات لە زارت بێ ها. چت لە ژنی خەڵکی داوە؟ شەرتبێ وەهات لێ بکەم! خەڵکینە! هۆۆۆ خەڵکینە! بزانن ئەم بۆرەپیاوە خوێڕیە چی لێم دەوێ. پێت وایە شار بووەتە هەرەجمەرەج؟ ئاخۆرانباخۆرانە؟ ئەی هاواار ئاژان ... بزانە چت لێ دەکەم. کوا ئاژان؟

وردەوردە دەرگا و پەنجەرەی مالآن دەبوونەوە. خەڵکێکی زۆر لێیان گرد بوونەوە و بەرەبەرە زۆرتریش دەبوون. حاجی سوور هەڵگەرابوو، دەماری ملی هەڵتۆقیبوو. لە بازاڕدا سەرشناس بوو و خەڵکیش ئاوا دووریزە و سێریزە پاڵیان پێکەوە نابوو و سەیریان دەکردن. ژنە تف و لیکی لێکدابوو و دەیقیژاند:

_جەنابی ئاااژان؟ کوانێی؟

حاجی ئەوەندەی رق هەستابوو بەر چاوی تار ببوون. دوو هەنگاو چووە پێش و هەتا گرتی لەبن چارشێوەوە لە بنگوێی ژنەی راکێشا .

_بێدەنگ بە بێدەنگ. دەنگت مەگۆڕە. ناسیمییەوە. سبەی ... هەر سبەی تەڵاقت دەدەم و بۆ سەیری دنیا و قیامەتێ تەنەکەت دە کلکی دەخەم! وات لێ هاتووە بەبێ ئیزنی من وەدەر دەکەوی؟ دەتهەوێ ئابڕووم ببەی؟ ژنەتیوە. هەی بێشەرمی بێدەرپ... ئیدی لێم گەرێ با لە نێو خەلکی زارم نەکەمەوە. خەڵکینە شاهید بن، ئەمن سبەی ئەو چەتیوە بێشەرەفە تەڵاق دەدەم؛ بەینێک بوو شکم کردبوو خۆ، دەمزانی، هەر دەمکوت چ نییە هەر دەمکوت چاک دەبێ. ددانم لەسەر جەرگم دانابوو بەڵام چی دی ناتوانم، گەیشتووەتە ئێسکانم. هەمووتان شاهید بن، ژنی من نانەجیبە سبەی ... خەڵکینە سبەی ...

ژنە لایەکی بۆ خەڵکەکە کردەوە و کوتی:

هەی بێغیرەتینە! دەمتان هەڵناپچرێ؟ راوستاون سەیر دەکەن و ئەم بێشەرەفە هەرچیپەرچیە دەست لە نامووسی خەڵکی هەڵێنێتەوە و لێی بدا؟ ئاخ ئەگەر مەشەدی وسێنی زێرنگر لێرە دەبوو، پێی دەکوتن. ئاخخخ! یانی یەک رۆژیشم مابێ تۆڵەی دەکەمەوە. وەهات عاقڵ بکەم ... کەس نییە بڵێ کابرا ئەخە کەر بە دەنگت دەروا؟ کێی سەروشکڵی مرۆڤت لە خۆت ناوە؟ برۆ برۆ با بگەیە پیاوی خۆت. شەرتبێ وەهات لێ بکەم ... جەنابی ئاژان...

دوو-سێیەک بەریوانکەر هاتن و حاجیان واوە برد. ئاژانێک وەدەر کەوت. خەڵک بڵاوەیان کرد و حاجی و ژنە چارشێو قەراغسپییەکە لەگەڵ چوار-پێنج شاهید و بەریوانکاران بەرەو شارەوانی رێ کەوتن، خەڵکیش بە دوایاندا. لە رێگادا هەر ئەم دەیکوت و ئەو دەیقۆزتەوە، هەرکامیان چیرۆکی خۆیان بۆ ئاژان دەگێڕاوە و خەڵکیش بە دوایاندا دەهاتن تا بزانن شتەکە چی لێ دێتەوە. حاجی لە عارەقەدا خووسابوو، شانبەشانی ئاژانەکە دەڕۆیشت؛ بەدگومان ببوو. لە ژنە ورد بووەوە، گۆرەوی و بەرەزمانەی کەوشەکانی ژنە لەگەڵ ئی ژنەکەی خۆی یەکتریان نەدەخوێندەوە. ئەو تەوسیفات و ناونیشانیانەشی باسی دەکرد راست بوون، ژنی مەشەدی وسێنی زێرنگر بوو. زانی کە بە هەڵەدا چووە. بەڵام درەنگ بوو تازە کار لە کار ترازابوو. نەیدەزانی چی لێ دێتەوە. گەیشتنە شارەوانی. ئاژان حاجی و ژنەی بردە ژوورێک و خەڵکەکەش لە دەرەوە چاوەرێ مان. دوو ئاژانی دیکە لەوێندەرێ کە وێدەچوو پلەیان بەرزتر بێ لە پشت مێزێک

دانیشتبوون. ئاژانەکە دەستی لە لاجانگی هەڵێنەوە و چیرۆکەکەی ئەو جۆرەی کە دیتبوو و بۆیان باسکردبوو گێڕاوە و پاشەوپاش کشاوە. سەرۆک ڕووی لە حاجی کرد و کوتی:

-ناوی بەڕێزتان؟

-گەورەم، نۆکەری جەنابتین. بچووکیمان هەیە لە خزمەتتاندا. ناوم حاجی مرادە؛ هەمووی خەڵکی گەڕەک و بازاڕ دەمناسن .

-چ کارەن؟

- چەڵتوک دەکوتمەوە. دوکانم هەیە، هەر فەرمایشتێکی هەتانبێ خزمەتکارم.

-ڕاستە بێڕێزیتان بەم خاتونە کردوە و لە نێو خەڵکی لێتان داوە؟

-چتان عەرز بکەم؟ پێم وابوو هاوسەری خۆمە.

-بۆ؟

-قەراغ چارشێوەکەی سپییە!

-سەیرە! یانی دەنگی هاوسەری خۆتان ناناسنەوە؟

حاجی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا: ئەخە گەورەم نازانن خۆ ژنی من چ بەلایەکە. هەر جرۆجانەوەرێک دەنگی هەبێ ئەوە ئەو دەنگەکەی وەکوو خۆی دەردێنێتەوە. لە حەمامێ دێتە دەرێ بە دەنگی پێنج شەش ژنان لەگەڵم دەدوێ و ئەدای هەموانیش وەدەر دەنێتەوە. وامزانی دیهەوێ فریوم بدا بۆیە دەنگی خۆی گۆڕیوە.

ژنە هەڵیدایەوە سەری:

- ئۆی ڕەبی خەجاڵەت بی. جەنابی ئاژان جەنابت خۆ شاهیدی، دیتت دی لە نێو ئەو هەموو خەڵکە شەقازلەی لە من دا. ئەوە ئێستاش خۆی فەقیر دەکا، هەی ئاوری بن کا. فڵتەفڵت! پێی وایە شاری کوێرانە. تەمەشا! ئەگەر مەشەدی وسێن بزانێ وات تەمبێ دەکا سەیر. کاری وا لەگەڵ ژنی مەشەدی وسێنی؟ جەنابی سەرۆک؟

سەرۆک: خاتون، کارێکمان بە جەنابتان نەماوە دەتوانن تەشریف ببەن با بزانین چ لە حاجی بکەین.

حاجی: وەڵا بە هەڵەدا چووم. نەمزانی، سەهوم کرد، ئەخە ئەمن لە نێو خەڵکی حەیا و حیسیەتم هەیە، نێوم هەیە، ئابڕووم هەیە.

سەرۆک شتێکی نووسی و دایە دەستی ئاژانەکە، پیلی حاجیی گرت و بردییە بەر مێزەکەی دی. بە دەستە لەرزۆک و سپیهەڵگەڕاوەکانی برە پارەیەکی وەک جەریمە پێ ژمێردرا و بردرا بەر دەرکی دەرەوەی شارەوانی. خەڵک پاڵیان وێک دابوو، سرتەسرتیان بوو دیاربوو شتێکیان بە بن گوێی یەکتردا دەچرپاند. عەبا زەردەکەیان لە شانی حاجی کردەوە و زەلامێک بە خۆی و بە قامچییەکەوە هات. حاجی هێندە خەجاڵەت بوو سەری داخست. پەنجا قامچیان لە پێش چاوی خەڵکی لێ دا بەڵام نە نێوچاوانی تێکنا نە دەنگی لێوە دەرهات. قامچیەکان خڵاس بوون و کوتەپارچەیەکی هەورێشمی لە گیفانی دەرێنا و نێوچاوانی پێ سڕییەوە. عەبا زەردەکەی هەڵگرت و لە بن هەنگڵی نا؛ لایەکی لە عەرزی دەخشا.

**سەری لە بەری خۆی ناوە و بەرەو خانووەکەی ڕێ کەوت. هەوڵی دەدا شلتر و لەسەرخۆتر لاقی بەرز بکاتەوە و هەنگاو بنێ، نەکا کەوشەکانی جیرەیان بێ.**

**دوو ڕۆژی بەسەردا تێپەڕی و حاجی ژنەکەی تەڵاق دا!**

**٤ی پووشپەڕی ١٣٠٩**

**پاریس**